# پێشەکی

هەرچەندە دیوانی نالی لەساڵی (١٩٣١)ی زایینیدا جارێکی لەلایەن کوردی و مەریوانییەوە و ساڵی (١٣٢٧)ی ئێرانیش بۆ جاری دووەم لە سنە لەلایەن (عەلی مقبل)ەوە بەچاپ گەیەنراوە بەڵام لەڕووی ئەوەوە کە کەشکۆڵێکی زۆر گەورە و گرنگم لەلایەن بەهەشتی حاجی مەلا محمد سعید (صدر العلماء)ی خاڵم لە سابڵاخەوە بۆ هاتووە وە چەند پارچە هەڵبەستێکی وای نالی تێدایە کە تا ئێستا چاپ نەکراون سا بۆ ئەوەی لەناو نەچن وام بە بەرژەوەند زانی کە دیوانی نالی سەرلەنوێ چاپ بکەمەوە.

## پایەی نالی لەبوێژیتیدا

نالی کە بەشای بوێژانی ناوبانگی پەیدا کردووە وە بزانم تەنها هەرێمەکانی کوردستانی باکوور نەبێ کە ئاشنایەتییەکی تەواویان بەسەر چەشنی زاراوەی سۆراندا نییە لەوانەیە باشی نەناسن بەڵام بەشەکانی تری کوردستان بە گەرمێن و کوێستانەکانیەوە نەک تەنها نالی دەناسن و بەس بەڵکوو بەشاسوارێکی ڕەندی مەیدانی ویژەو بوێژیتی دەزانن وە کەم خوێندەوار هەیە کە زۆرترینی هەڵبەستە تەڕو خۆش و دڵکێشەکانی نالی لەبەر نەبێ.

نالی لەمەیدانی پێشبڕکەی بوێژیتیدا پێشکەوتوویێکی دەست نیشانە سرشت (طبع)ی بە ئەندازەیەکی وای ڕام بووە کە نەک پابەندی کات و بێکاتی نەبووە و بەس، بەڵکوو دەستەڵاتدارێکی وا بووە ئەگەر ویستبای دەیتوانی سەرپاکی دووان و گفتوگۆکانی بە هەڵبەست بدرکێنێ.

نالی هاوتای ئەحمەدی خانی و شێخ ئەحمەدی جزیری و مەولەوی و کەیفی و فیردەوسی و سەعدییە؛ فیردەوسی لەپێش (١٠٥٠) ساڵاندا مێژوو و زمانی فارسی زیندوو کردۆتەوە و لەتەواوی شانامەکەیدا تەنها دوو وشەی عارەبی تێ کەوتوە داخوا نالی چی بۆ کورد و کوردستان کردووە؛ داخەکەم هیچ!!

# هەڵبەستەکانی نالی

هەرچەندە هەڵبەستەکانی نالی لەسەر شێوەی کۆنو مەلایانەن وە لەدەریای ووشەی فارسیو عارەوی‌دا خنکاون سەرڕای ئەوانەش لەڕووی ئەوەوە کە ئاوارە (جوهر)ی دەستەڵاتی ویژەییو بوێژیەتی خۆی لەناو بۆتەی زمانی شیرینی کوردی‌دا داڕشتووە بێ پایان شایانی سوپاسو مایەی شانازیو سەربڵندیتی‌یە ، چونکوو لەسەردەمی وی‌دا هەر ئەو جوورە هەڵبەستانە باو بوون وە بێجگە لە وەش سەودای بیانی پەرستیتی ئەوەندە پڕ تەووژم بوو هەر کەسێکی ڕاژەی زمانی کوردی بکردایە بە گومڕا لە پێنووس دەدرا ، ئەگەر نالیش وەکوو چەندین لە بوویژەکانی ترمان دەروازەی کۆگای خەڵەو خەرمانی هونەرو دەستەڵاتی ویژەیەتی خۆی بەزمانی بێگانان کردبایەوە چیمان لەدەست دەهات !! .

سوو ( شك ) لەوەدا نیە کەهەڵبەستەکانی نالی لەوپەڕی بەرزیو ئاوداری و دڵگری دان وەلەهەموو لایەکێکەوە ڕەوانو پوختو پەسندن وە زۆرترینیشی بە چەندین هەواو پەردەیەکی لەبارو تەڕو خۆشو دڵکێش لەلایەن دەنگ خۆشو گۆرانی بێژەکانی کوردستانەوە کراونەتە بەستەو گۆرانی ، کاکۆڵی هەڵبەستەکانی نالی ئاتاجیو پاکیان پەشانە کردنو هەڵگۆڕتو رانە ( وصف )و هەڵنان بە ئانوو پۆدا چوونە خوارەوەیان دانیە بۆیە کورتم بڕاندەوە .

# نالی و نیشتمان پەروەرێتی

ئەگەرچی نالی سەربەخۆیەتی نیشتمانەکەی خۆی بەچاوی خۆی دیتبوو لەپێش چاوی ویشدا ئەستێرەی بەختی بابانەکان وەرگەڕاوە هەرخۆشی یەکێك بووە لەوانەی کە لە مەزمەت زۆرو بێدادی جانەوەرانەی عثمانیان ئاوارەو دەربەدەر ببوو کەچی داخی گرانم لەبەر چارەڕەشیتی نەتەوەی کوردە کەزانایەکی وا ناودارو سەرکەوتوو و هۆشمەند سەرڕای ئەوانەی سەرەوەش کەم و زۆر هەستی گەل پەروەریو نیشتمان پەرستیتی نەبێ !

بەڵێ ئەوە حاشار نادرێ کەنالی پارچە هەڵبەستێکی بەناوی شێوەن و مێژووی کۆچی دووایی سلێمان پاشای بابانەوە داناوە کەئەمە سەرەتایە کەیەتی : —

( تا فەلەك دەورەی نەدا سەد کەو کەبەی ئاوا نەبوو )

وەبزانم ئەوەش لەڕووی هەستێکی پاکی کوردایەتیەوە نەبووە دەنا هەتیو نەدەبوو بەڵکو نەوس و شۆرباو خۆری پێی کردووە .

بەڵگەیەکی تر کە گرنگترین نموونەی دڵ ڕەقیتی و بێ بەزەیی و بێ هەستیەتی نالی لەراست کورداندا سوور دەکاتەوە ئەم دوو تاکەیەتی کەدەڵێ : —

طبعی شکرباری من کوردی ئەگەر انشادەکا   امتحانی خۆیە مقصودی لەعمداً وا دەکا

لێرەدا خۆی ددانی بەوە داناوە کەهەڵبەستی بۆیە بە کوردی داناوە چونکوو کوردی لەزمانێکی تر باشتر دەزانی خۆی تێدا تاقی دەکاتەوە ، لەوەشدا کەدەڵێ :

کەس بەألفاظم نەڵێ خۆ کردیە خۆ کوردیە   هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالبی معنا دەکا

لێرەشدا وا دەگەیەنی : کەسێکی نەزان نەبێ ڕەخنە لە هەڵبەستەکانم ناگری لە بەر ئەوەی کە کوردین چونکو مەبەس ووشە نیە بەڵکو واتایە بابەشوێنیدا بگەڕێن

حەبیبەی خێزانی کارێکی وای لەدڵی نالی کردووە کە تا دووا هەناسەی پابەندو دیلی وی بووە ، لە زۆرترین شوێنانی هەڵبەستەکانیدا هەر لەوی دەدوێ داخی گرانم ئەوەی کەجێگای موخابین بێ ئەوەیە ئەو هەموو هەنگامانەی کە

نالی بەچاوی خۆی دیتوونی ئەگەر بەقەد ١٠/ی حەبیبەی کاری نێ بکردایە دەیتوانی ئاتەشکەدەیەکی وا لەسەودای نیشتمانی بەربا بکات کە ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی پەیان پێ نەبردبا ، چونکو لەتوانای پێنووسە بەرزەکەیدا بو کەتەواوی ئەو هەموو خۆشی و ناخۆشیانەی کەبەچاوی خۆی دیتبوونی و ئاگاداریان بوو بەناوی پەندو ئامۆژگاری نەتەوەکەی و ڕازەی مێژوو تۆمار بکات .

جا مرۆ چۆن لەداخان نامرێت کەزاناو بوێژێکی وا بەسەلاندار لە جیهانی نیشتمان پەرستیتی هەواو هەوەس پەرست بی وەحەبیبەی بە هەموو کوردو کوردستان نەگۆڕێتەوە ؟ !

## نالی و یەك ڕەنگی

نالی هەرچەند لەناو دیوانەکەیدا لەزۆر شوێناندا پەلامارێکی زۆر مەردانەی بردۆتە سەر گەلێك شتی ناپەسندو نزم کەنموونەی پیتۆڵی و زانایی و سەربلندایەتیە کەچی داخە کەم هەر خۆی لەچەند شوێنێکی تردا خۆی دەکاتەرە خاکو خۆڵێ .

## نالی و مەستوورە

مەستوورە ( ماه شەرەفخانم )ی کوردستانی کەیەکێك بووە لە وێژەوان و بوێژە هەرە بایە بەرزەکانی کوردی سنەو خاوەندی دیوانە ، لەوانەیە کە لەدیار نالیدا کوتبێتیان هەڵبەستەکانی مەستوورە جوانن و پەسندن نالیش لەبەر نەکێشان و خۆپەسندی پەردەی ئابڕووی مەستوورەی دڕیوەو پەو بەندە ( مەستوورە کە حسناو ئەدیبە بەحیسابێ ) لەسنووری شێواز ( ئەدب ) زۆر تێ پەڕیوە کەچی سوك و هەرزەیی لەبوێژێکی وا زاناو مەردو دڕەندو بەشێواز ( مۆدب ) زۆر دوور بو هەزار موخابین !

گیوی موکریانی

# بەسەرهاتی نالی

نالی ناوی مەلا خدری کوڕی ئەحمەد شاوەیسە لەساڵی ١٢١٥ی کۆچی ڕێکەوتی ١٧٩٧ی زایینی لەشارەزووری لەدێی ( خاکو خۆڵێ )دا پێی ناوەتە ناو گیتی‌یەوە لەڕووی ئەوەوە ئەو دەمی شاری قەرەداغ کانگای زانستو خوێندەواری بووە وەزانا هەرە گەورەکانی دەوروبەری سلێمانی لەوێدا کۆ بیونەوە نالیش بۆ فێر بوونی هونەری خوێندەواریتی ڕووی لەقەرەداخ کردووە .

نالی هەر لەمنداڵی‌یەوە لەسروشتدا هەوەسی بەهەڵبەستان هاتووە وەلەسەرەتای هەرزەکاریتی‌دا چاوی بەکچێکی (حەبیبە) ناوی زۆر جووان دەکەوێتو حەزی لێ دەکات ، لەڕووی ئەوەوە ئاشکرەتە کە زۆر کاری کردۆتە سەر هەستو هۆشو دڵی نالی لە هەڵبەستەکانی‌دا زۆری بێ هەڵدەڵێ وەلەپێش ئەوەدا کە قەرەداخ بەجێ بێڵی مارەشی دەکات .

نالی لە هەموو تەمەنێکی‌دا دەریای سەودای لەبەرامبەر حەبیبەیدا تادەهات ئەووژمی جۆشو خرۆشی باگوڕ تر دەبوو هەتا جارێکی لەئەستەمبوولێ کوردێك لێی دەپرسی بۆچی بەو پیریەش ئەو ژنەت هێندە لەلا خۆشەویستە؟ لەوەڵامدا کوتی : چونکە سەرچاوەی هەڵبەستو وتنو مایەی سرووشان ( الهامات )مە .

نالی لەپاش چەند ساڵێکی دەچێتە شاری سلێمانی لەوێش‌دا ماوەیەکی لە مزگەوتی سەید حەسەنی لەلای زانای بەناوبانگ مەلا عبدالله ڕەش زانیاریەکانی ئەوسای تەواو کردووە ، بەبۆنەی ئەوەوە کە خانەقای مەولانا خالدیش کانگای زانستیو خوێندەواریتی بووە هاتوو چۆی دەکرد ، ئیتر لە ناوی زۆر پەیدادی تورکان ڕوو لەحەجێ دەکات .

لەحەجەوە گەڕاوە شامی و ماوەیەکی لەوێ مایەوە سەودای وڵات و دووری خزم و دۆست و ئاشنایەکانی ماخولیای دەکەن ناچار لەوێوە بەندێکی زۆر کاریگەر و بڕ تاسە و ئاوداری بە ناوی هەواڵ پرسینەوە بۆ کەس و کار و دۆستەکانی دەنێرێتە سلێمانی و دەپرسێ ئایا بێمەوە یا نا؟ کە ئەمە سەرەتای بەندەکەیەتی هەروەکو لە لاپەڕە ١٨ ی دیوانەکەیدایە: ( قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بای خۆش مروور )

لەو دەمەدا سالم لەوێ دەبێ بە بەندێکی زۆر درێژ و پەسند و نیشتمان پەرستانە و دڵسۆزانەوە هەروەکو لە لاپەڕە (٩٥)ی ئەم دیوانەدایە وەڵامی دەداتەوە لەوێدا زۆر و بێدادی و خوێنمژێتی تورکەکانی ڕۆمی بۆ هەڵدەڕێژێ نالیش بە ناهومێدی لە (١٢٥٥)ی کۆچیدا ڕوو لە ئەستەمبوڵ دەکات و لەلای ئەحمەد پاشای بابان زۆر بەڕێز دەبێ و هەمیشە مامۆستای پێ دەڵێت و بەخۆشی ڕادەبوێرن.

نالی لە ئەستەمبول لەگەڵ عمر ئەفەندی بابەجان لەدیار ئەحمەد پاشادا زۆرتریی گفتوگۆیان لەتەک یەکتریدا بە هەڵبەست بووە.

ڕۆژێکی پیرەمێردێکی سلێمانی لە ئەستەمبوڵ خەریک دەبێ قەنەفەیەکی نوێ بکا نالی دەست بەجێ دەڵێ ئەی مامە خدرە! ئەگەرچی قەنەفەکەی تۆ کارەبایە بەڵام تەرکی بکە، ئەم کارەبایە کانێکی کە سلێمان پاشای بابان کۆچی دووایی کردووە و ئەحمەد پاشای لە شوێن دانراوە، نالی لەبارەی مێژووی کۆچی ویدا پارچە هەڵبەستێکی داناوە کە ئەمە سەرەتایەتی:

( تا فەلەک دەورەی ئەدا سەد کەوکەبی ئاوا ئەبوو )

نالی سەرو ڕیش و سمێڵیشی سپی ببوو لەتەمەنی (٥٨)ساڵیدا لەئەستەمبوڵ لە(١٢٧٣)ی کۆچی ڕێکەوتی (١٨٥٥)ی زایینیدا کۆچی دوایی کردووە وەلەگۆڕستانی (أبا أیوب الانصاری)دا بەخاك ئەسپێرراوە.

دیوانی نالیو بەسەرهاتەکەیم لەوانەی خوارەوە وەرگرتوون :ـ

١ـ دیوانی نالی کەلەبەغدایە لە(١٩٣١)دا لەلایەن کوردیو مەریوانیەوە چاپکراوە

٢ـ « « کەلەسنە لە(١٣٢٧)ی ئیرانیدا لەلایەن (علي مقبل)ەوە «

٣ـ کەشکۆڵی ژمارە (٣)ی دەستنووسی مامۆستا نجم‌الدین مەلا.

٤ـ کەشکۆڵی ژمارە (٢) کەلەلایەن حاجی صدر العلمای خاڵمەوە بۆ هاتووە.

گیوی موکریانی

# چاپخانەی کوردستان

چاپخانەی کوردستان لە ساڵی (١٩١٥)ی زایینیدا لە لایەن مێژوو نووسی گەورەو گران داماو (حسێن حزنی) موکریانیەوە بۆ ڕازە (خزمەت)ی زمانو وێژەو مێژووی کوردی لە شاری حەلەبێ دامەزراوە .

# نالی

ئایا ئەم ناز ناوە لەبنچینەدا ( نالّی ) یا ( نالی )یە ؟

ویژەوانی ناودار مامۆستا ( علي ئاگا ) کە خۆی خەڵکی سلێمانیە دەڵێ : ـ

( لە ڕاوێژی بابان و جافاندا ووشەی نالّی بەو داو و تیسماڵك و هەودا باریك و درێژانە دەڵێن کە لەناو قەڵەمی قامیشی پێشوودا دەبینرا ، کاتێکی نووکی قەڵەمەکە لەمەرەکەبی دەدرا ئەسماڵکەکانیشی مەرەکەبیان دەمژی و لەسەردەمی نووسینیدا دووبارە مەرەکەبەکەیان دەداوە نالّی بۆ خۆشی لەم نالە هەڵبەستەی خۆی دا ئەم مەبەسەی بەتەواوی ڕوون کردۆتەوە ) : ـ

نالّی و مەتەڵی لە ئەشکەنجەیی غەمدا
وەك نالە کەنەیدا وەکوو نالّی لە قەڵەمدا
« کەوایە نالّی ڕاستەو نالی هەڵەیە » .
هەزاران سوپاس بۆ مامۆستا علی ئاگا

## ئاتابی سەری طرەیی پر پیچشی بادا

ئاتابی سەری طرەیی پـــرِ پێچشی بادا — هەر تایێکی بارێکی گوڵ و نافە بە بادا

گوڵ هاتە دەری لافی لەحوسنی بوتی مادا — لەرزینی قەدی بەرزی لە رقا زوانی کەبادا

شەو چەپکەنی نیلو فەریی و جیلوەی رقصی — شەرمەندە دەکا زوهرەی زەهرا لەسەمادا

خۆش صبح دەمێکە کەبەخەندەی دەنوێنی — بەس زەرەیی خورشید لەزەرِێکی سهادا

دەمدەم کەدەکا زاری پرِ ئازاری بەغونچە — بۆ دەعوەتی ماچی لەبە گۆیا دەمی نادا

سهم الف القد فقد صـــاد فؤادي — صـــاد هو من عينه قد صادف صادا

بۆ ماچی دەمی رەنگە لەعیشوەی خەمی ئەبرۆ — جۆیانی بەقا خۆی لەدەمی تیغی فەنادا

(نالی) کەغولامی مددی زولف و برۆتە — شاهێکە لەبن سێبەری باڵی دو هومادا

---

## پێم دەڵێن محبوبە خێل و قیچە مەیلی شەر دەکا

پێم دەڵێن محبوبەخێل وقیچەمەیلی شەرِدەکا — خێل و قیچە یاتەرازوی نازی نەختی سەردەکا

خێل وقیچ یابەغەمزە بۆ نیشانەی دڵ بەچاو — مەیلی راستە هابژنی مژگانی دڵ پێکرەدکا

چاوی هەمرەنگی گوڵەمەستی شەوورۆژ مەدام — یەکلەیەشکوتەی و ئەوشەی ئەکە نیلوفەردکا

عکسی چاوی تۆ لەچاوی دابەخواری تێدگەی — کەچ نظر کەی فرقی خوار و ژوور و خێر و شەردکا

کاتبی خێر و شەرِی عشاقە بۆ وصل و فراق — لطف و قهری هەربەجاری سەیری دودفتردکا

هەرکەسێ نقصانی روبێ بێتەسەر روی ئاینە — شاهدی هەرچەندە رأی العینە کێ باوەرِدکا

نالی ئەو وحشی غزالە کەس ئەبەرداوی نەکەوت — چونکە شاهێنی دو چاوی تیژە دائم سەردەکا

---

## ئەی جیلوە دەری حسن و جلەو کێشی تەماشا

ئەی جیلوەدەری حسن و جلەو کێشی تەماشا — سەررِشتەیی دین بی مددی تۆ نیە حاشا

فیاضی ریاضی گوڵ و میهر و مول و لەعلن — ئەی شوقی رخ و ذەوقی لەبت ذائقە بەخشا

ذەرانی عکوسی کەششی مێهری جەلالن    وادێن وەدەچن سەرزەدە سلطانو شەهەنشا

جان بەر لەبی بۆسەی لەبتە عاشق زارت    فالبائس یستوهب مـن فیك معـاشا

بەو رەحمەتی عامە کەدەکا سەنگی سیەزەرو    بەم قلبەکەوەك بەردەرِەشە رەشی رەشاشە

لا حول ولا طــول ولا قوة إلا    بالله له القــدرة والکائن ماشـا

(نالی) نیەنی سیحری بەیان قوەتی شعرە    ئەما هەیەتی قوەتی دڵ قدرەتی إنشـا

## تا سونبولی زولفت لە نیهالی قەدت ئالا

تا سونبولی زولفت لەنیهالی قەدت ئالا    من دوودبی هەناسەم گەیە عالەمی بالا

یا بدری علواً وضیـاء وکمـالا    الغصن مع الاصـل الی فرعك مالا

ما عاد لك البان ولا الایة لینـاً    اذ عد لك الباریء حسناً وجمـالا

من گریەو تۆ خەندە بەبەکدی دەفرۆشین    من لەعلی بەدەخشانو ئەتۆ لۆلۆی لالا

بادر وأغر کوکبة البدر بـــدارا    قد فقت سنا الشارق لاذقت زوالا

طرەت وەکو تۆماری شکستەو سەری کوڵمت    بۆ نووری سەوادم بووەتە شمسی موتالا

ئەو چاوە غزالە فەتەراتی سەرو ماڵە    ئەو تێر گزە کاڵە ئەمنی هێشتو ئەکالا

شقەی فلك الاطلس ئەستوونەیی زەرِیین    بێ بیکە بەتارایی سەرو سرکەیی والا

دونیا بەفیدای قەدیی بکەو دامەنی بگرە    طوبی لمن اختار علی المال مــآلا

(ناڵی) بەئومێدی ظفری تەوقی تەلەسمت    ماری سەری زولفت لەسەرو گەردەنی ئالا

## جۆشش و ئاوە لە نێو دیدەیی گریانمدا

جۆششو ئاوە لەنێو دیدەیی گریانمدا    چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی تـۆفانم دا

شەرِەرِی تابشو بارش لەدەمی رعدی بەهار    ئـەثەری سۆزشی گریانە لە ئەفغانم دا

شبهی زولفی سیەهو گۆنەیی روو گەردانی    بەسەری ئەو کە بەسەودا سەرو سامانم دا

قیمەتی ماچی دوسەد کیسەیێ ساغەو نیمە    غیری یەك کیسەیی سەد پارە لە گیرفانمدا
شێوەیی جامە کوتم یامەیە چابو فەرموی    عکسی لەعلی لەبی مەرجانە لە فینجانمدا
تۆکە خۆری وەرە تێو جێتی دیدەم چ دەکەی    لەم دڵەی پڕ شەرەرو سینەیێ سوزانمدا
باسی سیرری دەهەنی نوختە بەنوختەبکەرێ بێ    سەری موێکی نیە بێ نوختە لە دیوانمدا

( ناڵی ) ئەو نوختە کەوابوو بەنیشانەی چاوی
من لەصفحەی روخی ئەو دلبەرە نیشانمدا

---

## گەر بێ بە دەوری سەروی رەوانی لە ئیرەمدا

گەربێ بە دەوری سەروی رەوانی لەئیرەمدا    گەر نەبیە دەوری ئاهوی چینی لەحەرەمدا
عیشقت لەدڵو دیدەی پڕ ئەشکو ئەلەمدا    گونجایشو تسکینی نیە زۆرە لە کەمدا
بێ فایدە بوو لافی دەمی خونچە لە دەمیا    باخستی برینی حەقی کەسێکی لەدەمدا
دڵ مضمحلی دەردە وەکو دیدە لەئەندا    حەیرانو پەرێشانە وەکو قطرە لەیەمدا
(ناڵی)و مەئەلی خالی لەئەشکەنجەیی غەمدا    وەك ناڵە لەنەیدا وەکو ( ناڵی ) لەقەڵەمدا

---

## ئەستێرە هەموو محوە لەناو نووری قەمەردا

ئەستێرە هەموو محوە لەناو نووری قەمەردا    یا شەمسی جەماڵت شەوی گێراوە بەفەردا
خاکی بەری پێت هەم گڵە هەم کوڵ بەسرشکم    وەختی غەمو شادی ئەوە کردومە بەسەردا
تەلبیس نیە گەر کەسێ دێوانەیی رووتە    بەرگو جلی ناوی ئەوی دێوانەیی رووتە
رەنگی نیە روخسارەی رەنگینو لطیفی    رەوشەن بووە ئەم نکتە ثباتی لە نظردا
هەرچەندە کە إنسانە لەبەر چاوی منو تۆ    ممکن نیە ئەم نطفە لە انسانو بەشەردا
اثباتی خەتو خاڵە بەصەد دیدەی گریان    ناچێتەوە ئەم نوختە لەتێو دیدەی تەڕدا
شەوقی کەنەبی باصرە مأیوسە لەدیتن    هەم شەوقی ئەوە قوەتی دێتی بە نظردا

ئالودە نەبی تا بەزەیوون گیریی خوێنم　　بۆ کوژتنی من دامەنی پاکی لەکەمەردا
( نالی ) خبری بێ ئەثەری غائیبە ئەمما　　نالێکی حەزین دێ لە مناجاتی سحر دا

## تبسم دەردەخا حوقەی دەمی جەوهەر لەنێو ئاودا

تبسم دەردەخا حوقەی دەمی جوهر لەنێو ئاودا　　بەلێ مثقالە زەڕە ظاهرە جلوەی لەبرتەودا
بەپولێ نامەوێ دەرمان لە نشئەی چاوی بەعلت　　بەفلسی ئاکرم عنبر لە گەلێ زولفی ئەواسەودا
رقیبت خوفنەیی نابێنە نێچیرت کەخەر گورە　　ألیفی چایەرە دایم لەقەشقەی کەردزوجەودا
سلاحی بەرچەمی پرِغم أگەر ئارەوە گەرمارە　　برۆغەمزەی کەوانو تیر گەرهەوداو گەرمودا
لەأشکەنجەی شکەنجی زلفی أو بێ وعدمرغی دڵ　　دەنالێنی وەکو بولبول لەصبحی کاذبی شەودا
بەتیری دو نیشانە چانیەنەی روحەکەم شیرین　　بەغمزی ناقەیەک تیرێ لەفەرهادو لەخسرودا
وەها مەستی تەماشای چاوتە (نالی) کەنازانی　　بەبێداری دەبینێ یالەنەشئەی مەستی و خەودا

## روخم رەنگینی رەنگی رووەتی رەنگینتە بازا

روخم رەنگینی رەنگی رومەتی رەنگینتە بازا　　قەدی سەروم کەمانیی قەدی شیرینتە بازا
غریب و بێ کەس و زارو فقیرو خانەدانی تۆ　　جیگەر سوتاوو ماڵوێرانی زلفی چینتە بازا
معاذالله کە روحێکت بە حاڵی زاری من دابێ　　کەآخر بەندەیی خاکی دەری پێشینتە بازا
أگر خوێنم دەڕێژی تۆ أوە تیغ و أمیش گردن　　ئەگەر بنیادی پەیمان دەستی من دامینتە بازا
لەچاوانم هەتاکەی قطرە قطرە خوێن دەکەی ئەی دۆست
کەوا ئەم عهدو پەیمان و وەفا کابینتە بازا
بە ( نالی ) باوەڕت نابێ خەیاڵت بێت و بیبینی
کە چۆن مشغولی نەغمەی گۆشەی نالینتە بازا

## أحولى تەفرەقە نظر تقويەتى سبب دەكا

أحولى تەفرەقە نظر تەقويەتى سبب دەكا　　عارفى وحدت ئاشنا لەم قسەيە أدب دەكا
بەندى أزەل بەخطى خۆى قابلى قسمتى بوە　　ئێستە بەاقتضاى محل جێگەيى خۆى طلب دەكا
دارى ارا كو دارى هندهر دوكە عودە اسميان　　هەمدەمى سوتنەتە ئەم ئەو ميلى ابو لهب دەكا
سهمو نصيبى أصلى بە باسى گياهو گوڵ نيە　　سوتنەخەرجى سوتنە مودنەيە ماچى لەب دەكا
لومى زمان دەكا كە بۆچ خوارى وراستى دەڵێ　　غافلى دەستى راستى خۆت خزمتى دستى چپ دەكا
طوطى تۆلە حرصى دڵ بەندى طمع دەكا ئەمل　　بلبلى من لەعيشقى گوڵ تغنيەو طرب دەكا
(نالى) حريفى كەس نيە ألفو أليفى كەس نيە
بەيتى رەديفى كەس نيە تەفرەقە نووسە گەپ دەكا

---

## حيرەت زەدەوادیدە وەكوو حلقەى دەرما

حيرەت زەدەوادیدە وەكو خلقەى دەرما　　بێ پايە نيە عاشقى بێچـارە بەدەرمـا
بێ سەوى رەوانم كەلەبەر ئەشكى رەوانم　　خەرقە بوەتە غەرقە كەوا سەوزە لەبەرما
ئەى واعظى باردچيە هەروەك هەرسى كێو　　بەو وعظە كەوەك بايە ئەوەند هاتوە بەسەرما
بۆ هەركەسێ مبذولە طريقێكى أمانەت　　هەر عاشقى بێچارە لەرێى خوف وخطرما
ديدەم هەموشۆراوە بەشۆراوى سروشكم　　لەم لەوحە نيگارينە نەلەوحو نە أثر ما
وا ظن مەبە روخسارەى تۆ غائبە قوربان　　بنوارە چلۆن نەقشە لەنێو ديدەيى تەرما
يا تربەتى ياغـوربەتى بارێ بشكێنن
هەر منتظرە (نالى) ئەگەر مردو ئەگەرما

## طبعی شەکەر باری من کوردی ئەگەر انشا دەکا

طبعی شکرباری من کوردی ئەگەر انشا دەکا     امتحانی خۆیە مقصودی لەعمداً وا دەکا
یالەمەیدانی فصاحت‌دا بەمثلی شەهسەوار     بێ تأمل بم هەمو نەوعە زمانی رادەکا
کەس بەألفاظم نەڵێ خۆ کوردیە خۆ کوردیە     هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی طالبی معنادەکا
بێتە حجرە پارچە پارچەی مسودم بکرێ هەروح     هەرکەسێ کوتاڵ و پارچەی بێ بدل داوادەکا

شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری مـن بۆ نازکی
کەی لەدقت‌دا بەتك دەعوا لەگەڵ هـەودا دەکا

---

## بولبولی طبعم ئەوا دیسان ثەنا خوانی دەکا

بولبولی طبعم ئەوا دیسان ثنا خوانی دەکا     نکتە سەنجی و بذلە گۆیی گوهرأفشانی دکا
هەرکەسێ اظهاری دانایی بکات و مقصدی     خودپەسنەبی بێ یقین اظهاري نادانی دەکا
خرقەپۆشی کەی دەپۆشی جوهری ذاتی ئەمن     بێتە ئێو جلوەی بەزشتی خۆی بەعریانی دەکا
ضابطەی طبعم سوارە ادعای شاهی هەیە     محتشم دێوانە داوای تەختی خاقانی دەکا
شاهدێ بگرم کە بێتە جلوە گاهی دلبەری     شاهی خەسرەو روحی شیرینی بەقوربانی دەکا
نوکی خامەی من کە بێتە معنی آرای کماڵ     خط بەخط اظهاری نقشی صورتی مانی دەکا
استطاعەو قوەتی طبعم بەکوردی وفارسی     عارەبی اظهاری چالاکی و چەسپانی دەکا
خاطرێکی شۆخ و خۆشی و بێ غم و جمعم هەیە     ئێستە بۆ زولفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا
هدهدي دڵ حبسی بلقیسی سەبای دیوەیقین     خۆي کەدامێنگیری شاهی آصفي ثانی دەکا

ئـەو کەسـە تحدیثی نعمت بێ مرادو مطلبی
مثلی ( ناڵی ) امتثالی أمری یەزدانی دەکا

## ریشەکەی پان و درێژە بۆ ریا خزمەت دەکا

ریشەکەی پانو درێژە بۆ ریا خزمەت دەکا　　ظاهرە هەرکەس بەطولو عرضی ریشیدا ریا
گوڵ بەدەم بادی صباوە پێکەنی بولبول فری　　یعنی عاشق لازمە دور بێ لەیاری بێ وەفا
عاشقی صنعی حەقم قوربانی رەنگی قدرتم　　چاوی ماوی خاڵی شین کوڵمی سپی زانفی سیا
سەرگرانە قافلەی سالاری ربێ چین و خەتا　　چونکە باری عنبرو مشکە لەزولفینی دوتا
حلقە حلقە زانفی بەرقوبەی هەیاسەی کەوتوە　　بحری سبرە بەڵێ گەنجوری گەنجە نەژدەها
صوفی مەستورو روت و مفلسی خستە طمع　　سەیری خاڵی بێ حسابو ماچی لەعلی بێ بەها

ظاهرو باطن لەسەر لەوحی حقیقت یا مجاز
ئاشنای سبرڕی قەلەم بێ غیری (ناڵی) کەس نەما

---

## جنانی وەك جنان كردم بە مأوا

جنانی (*) وەك جنان كردم بە مأوا　　حبیبە ماڵی ئاوا ماڵی ئاوا
حەلالی بێ نیکاحی نوری عەینم　　بەجووتی ناظری شرعی فتاوا
زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم　　موبارەك حجلەیە بۆ بووك و زاوا
صداقی روو نماو وەصلی شاهد　　لەگەڵ شایی کەران بێ دەنگ و داوا

وصالی بێ کەم و کەیف و حضوری
لە (ناڵی) گەر دەپرسی یەعنی ئاوا

---

(*) جنان (جەنان) : دڵە

## پێچەیی پەرچەمی و پرچی سیا

پێچەیی پەرچەمی و پەرچی سیا    هەر دەڵێی مانگە شەوە کوڵمی تیا
لادە دەسرۆکەیی هەوری لەجەبین    دەرکەوێ شمس و قمر نورو ضیا
ئێوی تۆ ئاوی بەقا من خضرم    فیضی تۆ رەحمت و من سەوزە گیا
فەرشی کەفی پەری پێتە نێرگس    سەری داخستوە وەک چاوی حەیا
مەخمەرە هاویەی هەوڵی فراق    دەستی من دامەنی تۆ رۆژی قیا
بۆ ئەگەر کوردی تعال ئەر عرب    گێل ئەگەر تورکی وەگەر فارسی بیا
سەری ئەرهادەمو دەندوکی قوڵنگ    دەستی مجنونم و داوێنی چیا
خاطری زاهدو حاڵی خالی    نیە ئێستاکە بە بەینێکی ریا
دوور لەتۆ نیەدبی مەپرسە قوربان    حاڵی (ناڵی) کە نەمردو نەژیا

---

## زولفەینی بەخەم مارو بەحەلقەن وەکوو عقرەب

زولفەینی بەخەم مارو بەحەلقەن وەکو عقرب    شەعری لەفو نشرن چ مشوش چ مرتب
جێی دەم دەمە جێی لەب لەبە ساقی وەرە ئەمشەو    هەم ماچی دەماو دەم بدە هەم جامی لەبالەب
عاشق هەوەسی مەیکەدەو عیلمی بەسیطە    جاهل هەوەسی مەدرسەو جهلی مرکب
بۆ شەهدی کلامت کە بەاشرابی لطافەت    لذت دەگەیێنی بە دڵ و ذهنی مخاطب
وەک صوفی‌ی صافی مەبە ئالودەیی دونیا    بێهودە مکدەر مەکە سەرچاوەیی مشرب
عاجز مەبە هەرگیز لەدرۆو اوفکی رەقیبان    دونیایە دەبێ سەگ بوەڕێ شیمە بکا سەب
قاروونە فەلەک مستحقی گرتن و خەسفە    زێوو زەڕی شمس و قمرە درهەمی کوکب

قەلاّبی جیهان نەقدی عیاری نیە قوربان
(ناڵی) مەحەکی هیمەتی کردووە مجرەب

## ت

## چاوت لە برۆ یەعنی لەژێر تاقی نظارەت

چاوت لەبرۆ یەعنی لەژێر تاقی نظارەت      بێ پەردە عیان دێتە تکلم بە اشارت

شایستەیی شان لایقی مل طرەیی تۆیە      نەك طرەیی شاهەنشەهی و تەوقی وزارت

سەرخاتمەیی حسنی عبادەت کە نەهاتی      بارێ بگەرە فاتحەو دابی زیارەت

کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشوت      لەو تەختە کەوا خاوەنی مۆرن بەصدارت

دەسرۆکەو هەوری چ حیجابێکە کە تێیدا      شمس فلك الحسن أنارت فتوارت

هەرچەندە گوناهی دەمەکەت بارە لەسەر لێو

حەددی چیە (نالی) کە بڵێ ماچە کەفارەت

---

## مەکە اخلافی ئەم وەعدەی کەفەرمووت

مەکە اخلافی ئەم وەعدەی کەفەرمووت      دەخیلت بم کەخانەی صبرەکەم سووت

ئەمە لێوی ئەتۆیە پڕ لە خەندە      کەوا شەکر دەبارێ گوڵ دەپشکوت

چ شیرینە خطوطی دەوری لێوت      بەڵێ معلومە خۆشە خەطی یاقووت

لە سندوقی پڕی سینەم بترسە      کە ئاور بەر بداتە تەخت و تابووت

موژەت قوللابیە هەم تیرو هەم شیر      برۆت میحرابیە هەم تاق و هەم جوت

فیدای دەست و کەوانت بم بەتیرێ      دەپێکی سێ و دوو هەم تاق و هەم جوت

دەکەی نێچیری سەد دڵ هەر بەتیرێ      إلاهی هەر بمێنی دەست و بازووت

لەرووتی قووتی وەك من روو مەپۆشە      کەوەصلی تۆیە قووتی عاشقی رووت

هە (نالی) بەڵکی بیکێشین بەنالین

منالە دامەنیشە مات و مەبهووت

## ئەی سەروی بلند قەددو برۆتاق‌و مەمك جوت

ئەی سەروی بڵندقەدو برۆتاق‌ومەمك‌جوت  کێ دەستی دەگاتە بەی‌و ناری نەگەیشتوت
دەم هەمدەمی غونچەی کە نەپشکو نەهێشتا  باکەشێ‌ ٭ کردبەرگی عطرپۆشی گوڵی‌روت
گریانی من‌و خەندەیی تۆ ئێستە دەشوبهێن  بەو موسمی بارانە کەوا خونچە دەپشکوت
خرخاڵی قدم وەك خەمی زولفەینی سەرایات  پشتانی قەدت بێتو فیدای بازنی بازوت
خاڵی نیە (ناڵی) دڵەکەت‌ساتێ لەهجران  تا تاری وجودت نەپسێنی ملك الموت

---

## ماتم وەکوو زولفەینی سیەه گرتی سەرایات

ماتم وەکو زولفەینی سیەه گرتی سەرایات  پۆشی لەروخت تعبیەی بیدەق‌و شامات
تاقانە هەتیوێ خەلەفی قطرەی نیسان  تۆخۆشبی‌صدف‌بو بەفیدات‌دوربی‌لەئافات
بۆ فەوتی صدف حەیفە برِێژی دورِی ئەشکت  ضایع مەکە دورِدانە بەغارات‌و خەسارات
دیدەت‌وەکو گوڵ‌سورەبەری شەونمی ئەشکە  یا لەلای برِژاڵەیە دوو نێرگسی شەهلات
بەو گریەی تۆ رەنگە منیش هێندە بگریەم  گەوهەر برِژێنن بەبڵندی قەدو باڵات
لاکن ئەمە دونیایە گەهێ سورە گەهێ شین  لا یسأل من عاش ومن مات ومن فات
بەس گریە بکە بۆ پەدەرو بابی حەجابت  بێ بابی‌ی تۆ مورثە بۆ وصل‌و ملاقات
بێ بابی‌ی تۆ بۆ من‌و تۆ بابی فتوحە  بێ بابی‌ی تۆ خواستەی من بوە بەئاوات
بێ بابی مرادی من‌و تۆ بوو بەتمنا  بێ بابی دوعای من‌و تۆ بوو بەمناجات
ئەو بابە کە فتح‌و ظفرو قلعەی قمعی  باقلعی بکا زەلزەلەیی هادمی لذات
ئەو پیری خرف ئافەتی مەردی‌و صفا بو  تۆی شۆخ‌وجوان‌دوربی‌لەئافات‌و خورافات
ئەو فوت‌و وەفاتە سببی عهدو وەفاتە  چون صاعقەی‌بردی عجوزو گوڵ‌وملهات
گوڵ‌تاجی‌لەسەرناوچەمەن‌مخمەری پۆشی  هاموژدەیی خەلعەت گەیە بەر بەمباهات

هات زەمزەمەی بلبل و ئاوازەیی قومری — هات بای صباد بن وەدەچن عەرعەروبانات

نجم و شجرو نێرگس و أنواری شکوفە — جلوەی چەمەنن یعنی زەمین بو بەسماوات

ماوەردە لەسەر خەرمەنی گوڵ عطر فشانە — یا ئاوی حەیاتە عەرەقی ووردە محیات

گوڵشەن وەکو بەزمێکە لەآحادی هەزاری — بۆ تاقە گوڵێکی گەیی یە روتبەیی میئات

تۆ ساقیەو باقیەی صحنی چەمەن بە — مەیدان هەمو مەیدانە بەکاسات و بەتاسات

( نالی ) یەکو ئەو کەس کە تەمامی غزلی بیست

معلومی بووە زۆرو کەمی خارقی عادات

---

ث

# عمری بێ حاصلی من چوو بە عەبەث

عمری بێ حاصلی من چوو بە عەبەث — ئەمەلم هەرچی هەبوو چوو بە عەبەث

مهری بێ مهری دەرت گیراوە — لەمنی مایە صفەت چوو بە عەبەث

قصدی یاریتە لەگەڵ بەزمی رەقیب — یاری من خۆت مەکە بەدخو بەعەبەث

خانەیی دڵ کە خەرابە چ بلێم — بە خەیاڵت کە بفەرموو بە عەبەث

( نالی ) ئەو خونچە دەمە بێزارە

مەکە ماچی دەمی ئەر جو بە عەبەث

# عشقت کە مجازی بێ خوواهیش مەکە الا کچ

عشقت کە مجازی بێ خواهیش مەکە إلا کچ    شیرین کچ و لەیلا کچ سلما کچ و عذرا کچ
فرقی کوڕ و کچ ڕەو شەن وەك فرقی مەهو مهرە    وەك فرقی شەو و ڕۆژە ئەم فرقە لە کوڕتا کچ
مەه مەه لە مەهی سادە یعنی لەقەر لادە    هەم شمس و ثریا کچ هەم زهرەیی زهرا کچ
بێ بینە گوڵی ژاڵە هەم بێ بەرە هەم تاڵە    قەدسەروی سنەوبەر بەر چاو تیژ گسی شهلا کچ
کوڕ وەك گوڵی گوڵزارە أما ثمری خارە    وەك هەنگی جزو دارە هەنگوینی مصفا کچ
جانی ثمری سایە بۆ وصلەتی أعدا کوڕ    نخلی ثمری مایە بۆ دەوڵـەتی دونیا کچ
کوڕ زیبی دەبوستانە کچ شمعی شەبوستانە    بۆ بەزمی تەماشا کوڕ بۆ خەڵوەتی تەنها کچ
موو سنبلی ئاشفتە دوڕدانەی ناسوفتە    دەم خونچەیی نەشکوفتە تێفکرە نوڕەیا کچ
کوڕ ئاینەیی حوسنەتا وەك کچە منظورە    گرتی کە غباری موو چینی کوڕ و مینا کچ
کوڕ تازە و تەڕ مادام سادە وە کو خوشکی بێ    أما کەڕووا سەبزە دیبا کوڕ و زیبا کچ
بۆ شەربەتی شیرینی فنجانە لەسەر سینی    هەم تحفەیی تفاحی شەم عنبری بو یا کچ
هەم گوڵبونێ بێ خارە هەم مزرعی ازهارە    هـــەم مخزنی اسرارە اسبابی مهیا کچ
جنت بریِ وولدانە خادم هەموو غلمانە    خانم کەنی یاحورین یەکسەر هەموحسنا کچ
کوڕ اشرفی محبوبە یوسف کوڕی یعقوبە    کچ بوو بەخریداری یعنی کە زولەیخا کچ
صدیق و عزیز هەروەك یوسف کەنەبێ بۆ کوڕ
صدیقەی معصومە وەك دایکی مسیحا کچ

بابێکی هەیە دونیا بۆ عشقی مجازی بەس
( نالی ) جیبە ئەو بابە ئادەم کوڕ و حەوا کچ

## ساقی وەرە رەنگین کە بە پەنجە لەبی اقداح

ساقي وەرە رەنگین کە بەپەنجە لەبی اقداح　　بەم راحە لەسەر راحە دەڵێن راحی ارواح
بەم کاسە لەسەر پەنجە دەڵێن نوری علی نور　　رەخشانە لەمشکاتی قدحدا وەکو مصباح
قطرەی کەلەبەحری کرمو رەحمەتی فتاح　　نەک ئارەقی گەرمی عنبو شەربەتی تفاح
بەو دەستە کەوا مەرهەمە بۆ ئەو دڵی خەستە　　بەو پەنجە کە بۆ بابی گوشایش ئەوە مفتاح
بەو دەنو قەرابە کەدەکا پەشە بە عنقا　　نەک بەو خمی نیلە کە دەکا باغەبە تمساح
پرکە قەدەحی پرِ قەرەحی بێ طرحو غەم　　ناولنی ونادمنی وغازلنی بالافـــراح
لەم گەردشی مینایە کەوا دورە ئەجورە　　ساقي گەرەمی سابقە ( نالی ) بکە انجاح(١)

## التقای پۆلاوو ئاسن هەر نزاعەو گیرو دار

التقای پۆلاوو ئاسن هەرنزاعەو گیرودار　　جمعی ماەو ئاروزیندەو سردەو منحو وەقار
ئەم لەسەر تمظیمو گەورە گردنی ئەو بێ قصور　　ئەو لەسەر تحقیرو تخفیفو شکەو زارەمار
ئەم ئەچێ ئەو دادەنیشێ دەم وەکوو گوڵ خەندەران(٢)
ئەم دەبێ هەستێ کە ئەو بێ چاو یەکو قطرە هەزار
ئەم بەچاو دورِو بەسەر لعلی هدیەی بۆدەبا　　ئەو بەتف دەیکا بەمیزابی شکستەی آبشار
نظمی ( نالی ) مثلی ئاوە ئاینە ژەنگی نیـــە
دوو رووە بۆ سەیری خاطریەک خەفی یەک ئاشکار

---

١ـ انجاح : شاد .
٢ـ خەندەران : پێدەکەنی .

(نالی) لەشامەوە لەبەر خەمو خەفەتی ئاوارەیی و دەربەدەرێتی بەند(قصیدە)ێێکی وەکوو لەخوارەوە چاپکراوە بۆ دۆستەکانی دەنێرێتە سلێمانی لەو کاتیش‌دا سالم (عبدالرحمن بگ) لەوێ دەبێ بەناوی هەموو دۆستەکانیەوە وەلامێکی بەرز و پوختی دەداتەوە هەروەکو لەدوایی ئەو دیوانەدا وا بەبەرژەوەند زانرا کە چاپکرێ:

## قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور

قربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مرور　　وەی پەیکی شارەزا بەهەمو دەشتی شارەزور
ئەی لطفەکەت خفی وەهەوا خواهی هەمەدەمە　　وەی مرووەکت بەشارەتی سەر گۆشەیی حضور
ئەی هەم مزاجی ئەشکی ئەرو گەرمی عاشقان　　طوفانی دیدەو شرری قلبی وەك تەنوور
گاهێ دەبی بەروحو دەکەی باوەشێنی دڵ　　گاهێ دەبی بەدەم دەدەمێنی دەمی غرور
محوی جمالی خاطـــری عاطر شمیمتە　　گەردیی شمالو گێژیی جنوبو کزەی دەبور
سوتا رەواقی خانەیی صبرم دلو دەروون　　نەیماوە غەبری گۆشەیی ذکرێکی یاصبور
هەم هەمعنانی ئاهمو هەم هەمرکابی ئەشك　　رحمی بەم ئاهو ئەشکە بکە هەستە بێ قصور
وەك ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار　　وەك ئەشکەکەم رەوان بە هەتا ئاوی پردەسور
بەو ئاودخۆڵت بشۆ لە کدوراتی سەرزەمین　　شاد بن بەوصلی یەکدیی کە تۆی طاهر ئەو طهور
ئەمجا مەوەستە تادە گەیە عەینی سەرچنار　　ئاوێکی صافە پرِ لەچنارو گوڵو چنور
چەشمێکە مثلی خۆرکە لەسەد جێ بەرەوشەنی　　فەورانی نوری صافە لەسەر بەردی وەك بلور
یا عکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا　　ئەستێرەکانی رادەکشێ وەك شەهابی نور
یا چەشمەساری خاطری پرِ فیضو عاطرە　　یا ئاوی روح بەخشە کەوا دێ لە کێویی طور
دەمووت دوچاوی خۆمە اگر بە کرەحۆیی أشك　　بیوایە تیژوبی ئەرو گەرمو سویرو سور

داخل مەبە بەعنبەری سارایی خاکو خۆڵ    هەتا نەکەی بەخاکی سلیمانیا عبور
یعنی ریاضی روضە کە تێبدایە چەند دەمی    مشکین دەبی بەکاکۆڵی غلمانو زولفی حور
شارێکی عدلو گەرم لە جێگەیەکی خۆشو نەرم    بۆ دەفعی چاوو زارە دەڵێن شاری شارەزور
خاکی رەواجی عنبرە داری رەواجی عود    بەردی خەراجی گەوهەرە جۆباری عینی نور
شامی هەمو نەهارو فصولی هەمو بەهار    تۆزی هەموو عبیرو بخاری هەمو بخور
أهلێکی وای هەیە کە هەمو أهلی دانشن    هەم ناظمی عقودن و هەم ناظری أمور
سەیری بکە لە بەردو لەداری محـلەکان    دەوری بدە بەپرسش و تفتیشی خوارو ژور
داخۆ دەرونی شەق نەبوە بەردی سەرشەقام    پیرو فتادە تەن نەبوە داری پیرمەسور
ئێستەش بە بەرگ و بارە علمداری شیخ عباس    یا بێ نەواو بەرگە کراوە بەشخصی عور
ئایا بەجمع و دائـرەیە دەوری (کانی با)    یاخۆ بووە بەتەفرەقەی شۆڕشی نشور
سەیوان نظیری گومەزێکە بوانە سەوز و ساف    یاخۆ بووە بەدائرەیی ئەنجمی قبـور
ئێستەش مکانی ئادمە (کانی ئاسکان)    یاخۆ بووە بەملعبەیی گورگ و لورە لور
ئێستەش سرشکی عشق هەیە شێوەیی ئاودار    یاخۆ بوە بەسۆفی و وشکی لەحەق بەدور
داخۆ دەرونی سافە گوڕەی ماوەتا نجەرۆ    یاخۆ ئەسیری خاکە بەڵێلی ئەکا عبور
سەیرێکی خۆش لەچیمەنی نێو خانەقا بکە    ئایا ردیفی ئاهووە یا چاپەری سنوور
سەوزەلە دەوری گوڵ ئەڕوەک خەتی روی یار    یاپوشی وشکو زەردە وەکو ریشی کاکەسور
قـەلبی منورە لە حبیبـانی نازدار    یا وەک سەقەر پڕە لەرەقیبانی لەندەهۆر
دەست بەدیانەدێن و دەچن سەروو نارەوەن    یاحەلقەیانە سۆفیی مل خوارو مەندەبۆر
مەیلێ بکە کە سەوزە درەختانی مدرسە    أوراقیان مقدمەی شینە یانە سوور
ئێستەش کە ناری حەوشەکە جێی بازو کە وشەکە    یاری تێدایە یا بووەتە معرضی نفـور

حەوزی پڕی کەنابێ دیدەیی منە لەوێ ‌ ‌ ‌ لێڵاوی دانەهاتوە وەک سەیلی شیوەسور

چاوێ بخە لەسەوزەو سیرابی دائیرە ‌ ‌ ‌ جۆی جیلوەگاهی چاوەکەمە نەرمەیانەزور

داخۆ فضای دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش ‌ ‌ ‌ محشر مثالە یا بووەتە چۆڵی سەلم و طور

واصل بکە عبیری سلاوم بەحوجرەکەم ‌ ‌ ‌ چی ماوە چی نەماوە لەهەیوان و تاق و ژور

ئەو غاری یارە ئێستە پڕ اغیارە یانەخۆ ‌ ‌ ‌ هەر غاری یارە یا بوەتە غاری مار و مور

زارم وەکو هیلال و نحیفم وەکو خەیاڵ ‌ ‌ ‌ ئایا دەکەومە زار و بەدڵدە دەکەم خطور

لەم شەرحی دەردی محنەتە لەم سۆزی غربتە ‌ ‌ ‌ دڵ وەختە بێ بەئاو و بەچاوما بکا عبور

ئایا مجالی هاتنە لەم بەینە بێمەوە ‌ ‌ ‌ یا مصلحت توقفە تا یومی نفخی سور

حاڵی بکە بەخفیە کە ئەی یاری سەنگدڵ

( ناڵی ) لەشەوقی تۆیە دەنێرێ سلامی دوور

---

## سەیلی هیجرت بەردی بنچینەی لەرەک هێنادەدەر

سەیلی هجرت بەردی بنچینەی لەرگە هێنامەدەر باری فکری فەدی راستت تێی شکاندم وەک فنر شیری أبروت تیری غەمزت والەجەرگم کاریە دیت لەتۆ فانی دو چاوم لەتلەتی خوێنی جگەر چاو و دل شەریانە نازانم خەتای کامیانە خۆ تابەداری ئەم دەری کەم بیخمە شین و چەمەر نوری چاوم چاوەکەم بێ نور بێ تۆ ذەرەیێ خاکی دەرگاکەت بێژم بیکەمە کوحلی بصر دل مشبک بووە لەبەر نێشان و نیشانی برۆت ایشی چابو بۆیە هێندە گریام و خوێنی کەوتە سەر لەتلەت و کو اکون بوەدل واله شەوقی شیرەکەت رۆحەکەم دێت و دەچی داخوالە کامیان دێتەدەر هەرچی محبوبم دەبینی و تحیر دەبگرێ سوێند دەخوا دەلی باللە ما هذا بشر چەندە خۆشە دابنیشین دو بەدو ئەمن و گوڵم داکەوێنن مدعی لەو خوارەهەروەک دەسقەکەر رۆژ بەرستی ڕوتە ( ناڵی ) بۆیە دائم وەک غلام زەردو ئەردەن کەچ لەدەرگا حازرە دەستەو نظر

ز

خاو و بێ خاوی دوو زولفی خاوم ئەز    چاوە چاوی یەك غزالەی چاوم ئەز
گەر نیە ئاور لە سینەمدا بەتاو    بۆچ لەبەر قولقول غریقی ئاوم ئەز
ناری سینەم گەر نەبێ غەرقم ئەمن    ئاوی چاوم گەر نەبێ سووتاوم ئەز
غەیری زولفی تۆ کەرشتەی عومرمە    دەست لە مافیهای زەمان بڕیاوم ئەز
تازە ئەبرۆت وەسمە کێشاوە بە ناز    دڵ لەتی شمشێری تازە ساوم ئەز
ئەی رەفیقان صحبەتی ( نالی ) مەکەن    سووك دەبن ریسواوو هەم بەدناوم ئەز

---

ژ

## من کەریکم بوو چ پەیکەر طەیکەری هەورازو لیژ

من کەرێکم بوو چ پەیکەر طەیکەری هەورازو لێژ    سینە پان و مو چە کورت و شانە بەرز و گوێدرێژ
بێ زك و جبهت سپی کاك ئێستر و دامەن سیا    پێکە تازی سێ بڕو دو بادو شەشدانگ و درێژ
کەللە وەك جەرەی شەرابی پڕ نشاط و ئەردەماغ    شێری نەڕ ناموی بڕ گورگی سفر قاچی نەجێژ
مل علم شیرین قلم ئاهو شکم مەیمون قدم    سم خڕ و کاك ئێستر و منزل بڕو نارق ئەڕێژ
زەرق و زەڕاقی وەکو خاکوستر أمابێ غبار    برق بەراقی وەکو پیرۆزە لکن بێ کرێژ
سم وەکو پشم و لەبەشمی تو کی پێدا سەرنگون    چاو وەکو بیجادە یادو شەوچراغی شعلە ڕێژ
گوێدرێژی باری کورتان بەرد و پالانی بەزین    چومست و وریاتر لە گوێ کورتانی پالانی و گێژ
قانعی بابی رضاو ڕازی بەیوش و درك و دال    سالکی صبرو تحمل بوردە بارو هیچ نەبێژ
صائم الدهری بەرۆژ أما بەڕۆژوی بێ نیەت    قائم اللیلی ملوك أما سلوکی بێ نوێژ
عاقلێ بوو ناوی کەر بو قاطعی ڕێگەو سفر    خۆش سلوکتر بو لەسەد انسانی هرزو گێژوو یژ

هێندە پێم خۆش بوو زمانی حالی دەیووت ( نالی ) یا
هەردوو حیوانین ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ

س

## سابوونی بەری پیتە کەفی زاری چاپلووس

سابوونی بەری پیتە کەفی زاری چاپلوس    خاصیەتی رەقی هەیە نەرمی زمانی لوس
ئەی دلٚ خەراجی حاصلی ظلمانی بحرو بر    میرانی اعتبارە لەفرزەندی فیلقوس
بیبانی کبرو سەرکەشیە تەقی کیسرەوی    دانانی ظلم، رِو رِەشیە تەختی ئابەنوس
بنوارە بوونی أوەلتو چوونی آخرت    حانی چە روتو قوتو هەلاٚنی چلوسو پوس
گەر فەرِو زینەتو شەوکت وەفای دەبو    بێ دەردی سەردەمانەوە بۆ تاوسو خەروس
گەر آبو تابی جنقو دۆزەخیت دەویٚ    بنوارە ناوچەوانی بەشوشو برۆی عبوس
بۆ مەشقی عشق زوانی نیگاو نیگارشی    نالی لەخەمدا بوە تەماشاهی طورِە نوس



## کە تۆ هاتی لەنەومیدی نەما باس

کەتۆ هاتی لەنەومێدی نەما باس    لەهیجرو انتظار ئیدی نەما باس
لەسایەی زولفی تۆوە شەو درێژە    لەصبحو نوری خورشیدیٚ نەما باس
فەلەك تۆیدا کەئەمشەو رۆژمان بێ    لەرەجمو نەجمو ناهیدی نەما باس
حوادث جامو دەوران بوو بەساقی    لەبەزمو جامی جەمشیدی نەما باس
شوکر جەمعیەتێکی بێ نیزاعە    لەشەرِدی مدعیو کەیدی نەما باس
رِەقیبو مدعی هەردوو لەخەودان    هەتا چەند سەعاتێکی دی نەما باس
سەماعو گەردشی عیشقە حقیقت    لەصوفی رەقصی تقلیدی نەما باس

لەسایەی قەددی موزونو دوو زولفی
لە (نالی)و شیعرو تسوێدی نەما باس

## لەکن ئەو جەوهەریی فەردە لەهیوو لانیە باس

لەکن ئەو جوهەریی فەردە لەهیو لانیە باس    لەحکم پەروەریی بوو علي سینا نیە باس

صۆفیان هاتنە مجلس وەرەق دیدە بشۆن    لەکن ئەو دێمیە وشکانە لەدەریا نیە باس

ئەمە جێی رمز و اشاراتی درونە لەگەروی    ئەمگی برِ غر غرەیی واعظی غرا نیە باس

لەبەر ئاوبێزەیی چاوی نیە کەللەی سەریان    لەکەی و قیصرو ئەسکەندەرو دارا نیە باس

بەزمی رەندانە ئەمە ملعبەیی وعظە نیە    لەبەدو نیکو قوللابی دونیا نیە باس

جێی زمان گرتن و دڵ روشنی و سوتانە    مقتدا شمعەکە خامۆش نیە أما نیە باس

حضرتی هەیبەتە ئەك غیبت و رەیبت نالی    الله الله چ حضوریکە کەأصلا نیە باس

---

ط

## مووی سپی کردم بەشوشتن ئاوی عینی شۆرە شط

موی سپی کردم بەشوشتن ئاوي عینی شۆرەشط    شۆرەشط یعنی کەتێیدا خودبەخود قل بوبەبط

هەڵکراوەك مۆمی کافوری لەشەودا مۆم بەمۆم    واسیەرو بوبەخوێنم نوخنەنوخنە بەخطخط

من دڵێم شو بوبەرۆژ تقسیم دڵی رۆژ بوبەشەو    ئەو مصیبە چونکە چاوی بێ سپی بومن غلط

رەوغەنی دیدە رژابە سەر کتابی خطی خۆم    چالەبێشی ئەو سپی نوریش بەسەر ئەودا سقط

سردو گرمی آهەکەم سۆزی گیای کردم بەپوش    پایزي رِو بو بەبەردی سور زەردی مختلط

وجهەکەم اسمی بیاض أما ورق زەردو سیا    بامخطط بێ بەکافوری کەشیدەی خوش نمط

چونکە لوحی دو سیاڕو زەردیي بێ تزیینە    خوێنی چاوم جدولی بێ قطرە کانیشی نقط

نقشی دوموی بەدوری روی دبێتە عیبی شیب    ئایینەي رو پاکیە روو ناکیە نورو شمط

یا گەدایێکە غنی    یا پادشاهێکە فقیر

لەم دووە خالی نیە (نالی) لەروی حدو وسط

## ق

### قوربان مەحالە پێکەوە بێ صبرو اشتیاق

قوربان مەحاڵە پێکەوە بێ صبرو اشتیاق    خارج لەنەی ئایەتـــە تکلیفی لا یطاق
معنای نورو ظلمتو نشری حیاتو موت    وەك رو و زلفە رۆژی وصالو شەوی فراق
اظهاری ادعای تصبر لە وصلی تـــۆ    یا مەکرە یا دەسیسـەیە یا کذبە یا نفـاق
بۆ تۆ کە بکرو تازە وەکوو حوری جنق    قەیدی چیە عجوزەیی دونیا بدەم طلاق
شیرینە لەتاڵیو ترشی خلاصە رووت    خاڵت لەسەر جبین بووەتە دانەیی سماق
صوفی لەفقرو فاقە وەکوو فاقـە فاقیدا    تسبیحی دامو دانەیی ریشی دو فاقی فاق
ئەی مبهری مبهرەبان وەرەسەر بامی بامیداد    تا مەھـروان بین بەھیلالی شەوی محاق
( ناڵی ) کە صەدری مەصنەدی تەمکینی تەکیە بوو
بۆ تۆ بووە بە دەربەدەری کوچـەو و شقاق

### چی‌یە گووارە گوناهی وا بەنەستەق

چی‌یە گووارە گوناهی وا بەنەستەق    بە گوێی هـەڵناوەسیوە سەر معلق
ئـەتۆ قوربان نەخیلی یا دوطابی ؟    وەها شیرینو سینە نەرم و دڵرەق
سەراپای گرتووی زولفت بەوی بوی    مقید هەم مخلخل هـەم موو طەوەق
لەپێت ئاڵاوە حەلقەی ماری گێسوت    عجایب حی‌ی بێ گیان قـەیدی مطلق
کەلیلۆو سورو کول بوو چاوی تیژت    ئەوەندەی بێ دەرێژی خوێنی ناحەق
شکر ( ناڵی ) سەری خـەصمت وەکوو گۆ
بەخوواری ئەك بەیاری دایە بەر شـــەق

## ئەی شۆخی بێ نیازو گران نازو غەمزە سووك

ئەی شۆخی بێ نیازو گران نازو غمزە سوك    تیری مژەت نیشانەیی دڵ کون دەکا بەنوك
کوشتەی نگاهی مەیدتە گەرمەست آگەو خراپ    بەستەی کەمەندی زلفتە گەر شێخ ئەگەر ملوك
نەقدی دڵی ئەرایجی سەودایی تۆ نەبێ    مغشوش وکەم عیارەوهەم قلب وهەم چروك
صۆفی وەرە بچینە ظهوراتی باغو راغ    لایی هەمو شکۆفەو لایی هەمو گوڵوك
دەستی چناری رو توسەری شاخو کێوو گوڵ    رازاونەوە بەخەڵەتی دیباوو بەرگی توك
دەسبەندیانە دێنو دەچن سەروو نارەوەن    خاوەن کڵاوو سایەوو بەرگن وەکو ملوك
کانی دەزین بەتاوو دەرخت ئاوسن بەبا    شادیی بەهارە بولبولە دامادو غنچە بوك
وەك چاویی وشکە سۆفی ە کاپەدارو بەردە    دەردێن بەسەد تەرەنومو گریانو نوکە نوك
رابێڵێ تارو پودیی کاوی بەفرو ئاپشار    بابای دەدات و مامی پێ یادێ وەکومە کوك
شەونم کەنظمو نەثرە لەأوراقی غونچەدا    گۆیا بووە بەزارو زمانو ددانو پوك
(ناڵی) عجب بەقوت و حکمت أدای دەکا    معنای زۆرو گەورەیە بەلفظی کەمو بچوك

---

## بەزستان دڵ شکستەی بەردو سەرمام

بەزستان دڵ شکستەی بەردو سەرمام    بەهاوین جەستە خەستەی دەردی گەرمام
لەقربی قاب قوسەینی دوو ئەبرۆت    مەنی أدنا چ دوورو دەربەدەر مام
لەهێلانەی زەمین دا وەك شوتور مورغ    منی قودس ئاشیان بێ باڵو پەر مام
نەفەس هەروا لەرێدا دێت و نایێ    لەسەیرو سەیری أسبابی سەفەر مام
دەمێکە وا لەسەر پێیەك دەسووتێم    لەشەوقی تۆ بەمثلی مۆمو هەر مام
وەرە قوربان بەگیان هەردوو برا بین    کەتۆ بی مادرو من بێ پەدەر مام
بەلا گەردانی باڵات ئەگەر چووم    فیدای هیندویی خاڵت بم ئەگەر مام
لەدار العلمی تحصیلی مەعاریف    وەکوو (ناڵی) جهول و بێ خەبەر مام

